


پرۆژەی لە خزمەت ئیمامەکانی ئەهلی سوننە و جەماعەت

# ئیبن عەبدولبەڕ







نووسینی

سەرباز موحەممەد

پڕۆژەی

"لەخزمەت ئیمامەکانی

ئەهلی سوننە و جەماعەت"

یەکەم

ئین عەبدولبەڕ

بسم الله الرحمن الرحيم

پرۆژەی

"لە خزمەت ئیمامەکانی ئەهلی سوننە و جەماعەت"

# یەکەم ئیبن عەبدولبەڕ


نووسین: سەرباز موحەممەد

پێداچوونەوە: هەرمان دەروێش



## کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی



بەڕێوەبەری گشتی: موحەممەد خدر ئەحمەد ٠٧٨٢٤٦٧١٣٩٤ - ٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤

بەڕێوبەری هونەری: موستەفا موحەممەد کوردی

فەیسبووک: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/ M.Ktebxana

ئینستاگرام: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/ M.Ktebxana

لقی یەکەم: بەرانبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری

لقی دووەم: چوارڕیانی شێخ مەحموود - بەرانبەر مزگەوتی مەحموود عەللاف

mdmaktaba@gmail.com

نەخشەسازیی ناوەوە: موستەفا موحەممەد کوردی

نەخشەسازیی بەرگ: زەردەشت کاوانی

چاپی یەکەم: ٢٠٢٣

پێوانە: ١١*١٦

تیراژ: ١٠٠٠

لاپەڕە: ٩٠

لە بەڕێوبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان - هەرێمی کوردستان

ژمارە سپاردنی (١٧٠)ـی ساڵی (٢٠٢٣)ـی پێ دراوە

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# پێشەکی

حەمد و سپاس بۆ ئەو خوایەی کە پێغەمبەری خۆشەویستی (ﷺ) کرد بە دوا پێغەمبەر و ئوممەتەکەی کرد بە دوا ئوممەت و کتێبەکەی کرد بە دوا کتێب و شەریعەت. سپاس و ستایش بۆ خوای گەورە کە دەفەرمووێت:

{قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُو الْأَلْبَابِ ۝٩} [الزمر] ئەهلی عیلم و ئەوەی نازانێت، قەت وەکوو یەك نین. بۆیە پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) لە خوا دەپاڕێتەوە بۆ عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس و دەفەرمووێ: (اللهُمَّ فَقِّهْهُ فِي الدِّينِ،

وَعَلِّمْهُ التَّأْوِيلَ.)[1] خوایە فیقهی لە دین زیاد بکەی و فێرە تەفسیری قورئانی پیرۆزی بکەیت.

هەر لەبەر ئەوەشە حورمەتی ئیمامەکان و خۆشەویستییان، لە دیندایە و، ئاشنابوون بەو ئیمامانە، سوودێکی زۆری هەیە؛ بە تایبەت لە زەمەنێکی وەکوو ئەوڕۆماندا کە هەوڵێکی زۆر لە ئارادایە بۆ شکاندنی هێماکانی ئەهلی سوننە و جەماعەت و خستنیان لە بەرچاوی گەنجەکانی ئەم ئوممەتە. بەوەش دەتوانن بگەن بە ئامانجە گڵاوەکانیان لە شێواندنی ڕاستییەکان و بەلاڕێدابردنی هەنگاوەکان.

---

١ مسند أحمد ط الرسالة (٥/ ١٦٠)

ناساندنی ئیمامەکان، ئەگەر بە کورتییش بێت، بە ئەرکێکی گەورە دەزانین. هەر لەبەر ئەوەشە دەستمان کرد بە نووسینی ئەو زنجیرەیە (لە خزمەت زانا و ئیمامەکانی ئەهلی سوننە). خوای گەورە لێمانی قەبووڵ بکات و تەرازووی کردەوەی چاکەمانی پێ قورس بکات.

## عەقیدەی ئیمام (ئیبن عەبدولبەڕ)

ناوی: یووسفی کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی موحەممەد کوڕی (عاصم النمري)ـیە. بە ئەبوو عومەر بانگیان کردووە. باوکی گەورەزانای شاری قوڕتوبە بووە. (النمري) نیسبەتە بۆ "نەمری کوڕی قاسط"، کە هۆزێکی گەورەی ناسراو بوونە. ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ لەساڵی (٣٦٨)ـی کۆچی، لە شاری قوڕتوبە لە دایک بووە. باوکی زانا بووە و دایکی ئافرەتێکی خواناس بووە. بنەماڵەی ئەوان بە دینداری و خواناسی ناسراو بوون. ساڵی ٣٨٠ باوکی وەفات دەکات. قوڕتوبە ئەوکات پایتەختی دەوڵەتی ئیسلامی بووە لە ئەندەلووس (ئیسپانیای ئێستا)، شاری زانست بووە و ژیاری ئیسلامی بووە. ئیمام ئیبن

عەبدولبەڕ لە مەمملەکەتی ئەندەلووس دەرنەچووە، بەڵکوو لە شارەکانیدا بە دوای زانستدا گەڕاوە و چووەتە خزمەت زاناکانی سەردەم و لە خزمەتیان دانیشتووە، تاوەکوو گەیشتووەتە ئاستێکی ئەوەندە بەرز، لە ئیسلامدا بە حافزی مەغریب ناویان بردووە. سەرەتای تەمەنی لەسەر مەزهەبی "زاهیرییەکان" بووە، دواتر چووەتە سەر مەزهەبی ئیمام مالیك و زۆریش بە ئیمامی شافیعی کاریگەر بووە. ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ تەمەنێکی زۆری هەبووە و نزیکەی (٩٥) ساڵ ژیاوە. واتە لە ساڵی (٤٦٣)ـی کۆچی وەفاتی کردووە (ڕەزا و ڕەحمەتی خوای گەورەی لەسەر بێ).

ئیمام ئیبن تەیمیە، بە ئیمامی ئەهلی مەغریبی ناو بردووە (إمَامِ أَهْلِ الْمَغْرِبِ). مجموع الفتاوى (٥/

٨٧). ئیمام ئیبن قەییم کە باسی ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ دەکات، دەفەرمووێت: [ذِكْرُ قولِ بُخَارِى الْغَرْبِ الْإِمَامِ الْحَافِظِ أَبِى عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْبَرِّ إِمَامِ السُّنَّةِ فِى زَمَانِهِ رحِمَهُ اللَّهُ تَعَالى] اجتماع الجيوش الإسلامية (٢/ ١٤٣). واتە بوخاریی خۆرئاوا، ئیمام و حافیز و ئیمامی ئەهلی سوننە لە زەمانی خۆیدا. مەبەستیشی لە بوخاریی خۆرئاوا ئەوەیە، کە چۆن ئیمام بوخاری لە خۆرهەڵات هەڵکەوتووە، ئەویش لە خۆرئاوا هەڵکەوتووە.

ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ کتێبی زۆری نووسیون. لە کتێبە هەرە گرنگەکانی، کتێبی (التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد)ـە، کە سی دانە ساڵ خەریکی

نووسینەوەی ئەو کتێبە بووە. بۆیە کە تەواوی دەکات، دەفەرمووێت:

سَمِيرُ فُؤَادِي مُذْ ثَلَاثِينَ حِجَّةٍ
وَصَيْقَلُ ذِهْنِي وَالْمُفَرِّجُ عَنْ هَمِّي
بَسَطْتُ لَكُمْ فِيهِ كَلَامَ نَبِيِّكُمْ بِمَا
فِي مَعَانِيهِ مِنَ الْفِقْهِ وَالْعِلْمِ
وَفِيهِ مِنَ الْآدَابِ مَا يُهْتَدَى بِهِ
إِلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَيُنْهَى عَنِ الظُّلْمِ.

ئیمام ئیبن حەزم دەربارەی ئەو کتێبە دەفەرمووێ:
(وهو كتاب لا أعلم في الكلام على فقه الحديث مثله أصلا، فكيف أحسن منه.)[2].

---

٢ بغية الملتمس، لاپەڕە ٤٩٠

ئەو چـاپەی کە لای ئـێمەیە، چـاپی (دار احیـاء الــتراث العــربي)یە (٩) بەرگە. ئەوەی تەحقیقـــی کردووە، ناوی عەبدولڕەزاق مەهدییە.

ئیمام زەهەبی لە کتێبی (تاریخ الاسلام) کە باسی ساڵەکانی (٤٦٢)ـی کۆچی دەکات، باسی وەفاتی ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ دەکات و دەفەرمووێت: (وکان فی اصول الديانة على مذهب السلف لم يدخل في علم الكلام، بل قفا اثار مشايخه.) هەروەها دەفەرمووێت: (وكان سلفي الاعتقاد متين الديانة.)

بە هەمان شێوە کتێبێکی تریشی زۆر گرنگە، ئەویش کتێبی (الاستذكار الجامع لمذاهب فقهاء الامصار وعلماء الاقطار فيما تضمنه الموطأ من معاني والاثار وشرح ذالک کله بالايجاز والاختصار)ـە.

(دار الکتب العلمیة) چاپی کردووە و (سالم محمد عطا) و (محمد علي معوض) تەعلیق و حاشییەیان بۆ داناوە. ئەو دوو کتێبە تەواوکەری یەکترن.

ئەوەی لێرە مەبەستمان بێ -پشتیوان بە خوای گەورە-، قسەکردنە لەسەر عەقیدەی ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ. عەقیدەی ئەو ئیمامە ڕێک عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعەتە، لەبەر ئەوەی ئەوانەی کەوتوونەتە تەجسیم و تەشبیهەوە، وای نیشان دەدەن وەک بڵێیت ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ، لە عەقیدەدا هاوڕای مەزهەبی ئەوانە. ئەوانەی باسیان دەکەین، واتە ئەو کەسانەی کەوتوونەتە تەجسیم و تەشبیهەوە، مەنهەجی ئەوان لە عەقیدەدا، پشتبەستنە بە فەرموودەی هەڵبەستراو و لاواز، کە ئەوەش

پێچەوانەی کۆدەنگیی زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعەتە. عەقیدە دەبێت یان لە دەقێکی قورئان، یان فەرموودەیەکی سەحیح وەربگیرێت. ئەوەی تر، (مەبەستم لە فەرموودەی لاوازە) مەگەر تەنیا لە پاداشتی کردەوەکان (فضائل الاعمال) وەربگیرێت. لەو کاتیش دەبێت ئاماژە بەوە بکرێت کە ئەوە فەرموودەیەکی لاوازە. بۆیە زۆر گرنگە بزانین ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ چۆن لە ئایەت و فەرموودەکانی ناو و سیفەتەکانی خوای گەورە گەیشتووە. بۆیە لەو نووسینەدا تەنیا باسی تێگەیشتنی ئەو ئیمامە لە بابەتی ناو و سیفەتەکانی خوای گەورە دەکەین، نەک گفتوگۆکردن لەسەر بیر و بۆچوونەکانی.

## یەکەم: مانای (الملل) "بێزاری"

وَحَدَّثَنِي عَنْ مَالِك، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي حَكِيم، أَنَّهُ بَلَغَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، سَمِعَ امْرَأَةً مِنَ اللَّيْلِ تُصَلِّي، فَقَالَ: «مَنْ هَذِهِ؟» فَقِيلَ لَهُ: هَذِهِ الْحَوْلَاءُ بِنْتُ تُوَيْتٍ لَا تَنَامُ اللَّيْلَ، فَكَرِهَ ذَلِكَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، حَتَّى عُرِفَتِ الْكَرَاهِيَةُ فِي وَجْهِهِ، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى لَا يَمَلُّ حَتَّى تَمَلُّوا، اكْلَفُوا مِنَ الْعَمَلِ مَا لَكُمْ بِهِ طَاقَةٌ» الاستذكار (٢/ ٨٧).

«إِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى لَا يَمَلُّ حَتَّى تَمَلُّوا، اكْلَفُوا مِنَ الْعَمَلِ مَا لَكُمْ بِهِ طَاقَةٌ» لە کاتی عیبادەتدا، دەبێت ئەوەندە عیبادەتە بکەیت کە لە تواناتدایە، نەوەک

ماندووبوونێکی وا لە عیبادەتەکان، تاوەکوو لێی بێزار ببیت و بە دەر بێت لە توانای تۆ. وەکوو زۆر کەس لە سەرەتای دینداریدا، ڕۆژانە نوێژێکی زۆری نافیلە دەکات و زۆر جاریش جگە لە ڕۆژانی دووشەممە و پێنچشەمەیش، بەڕۆژوو و دەبێت. دواتر وردە وردە سارد دەبێتەوە. ئیتر دەبێت خەمی ئەوەمان بێت، فەرزەکانی لە دەست نەدات! بۆیە ئەو کاتەی لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی ئافرەتێکیان کرد کە زۆر خۆی بە عیبادەتەکانییەوە ماندوو دەکات، ئەوکات خۆشەویستمان (ﷺ) فەرمووی: «مَهْ، عَلَيْكُمْ بِمَا تُطِيقُونَ، فَوَاللَّهِ لاَ يَمَلُّ اللَّهُ حَتَّى تَمَلُّوا» وَكَانَ أَحَبَّ الدِّينِ إِلَيْهِ مَادَامَ عَلَيْهِ صَاحِبُهُ. رواه البخاري.

بۆیە دایکی بڕواداران عائیشە دەفەرموویت: خۆشەویستترین کردەوە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەو کردەوە چاکەیەیە کە خاوەنەکەی بەردەوام دەبێت لەسەری، ئەگەر کردەوەیەکی کەمیش بێت. واتە بەردەوامی چاکترە لە کردەوەیەکی زۆری چەند ڕۆژێک و دواتر بێزاربوون. ئینجا بۆ چارەسەری ئەو حاڵەتە، پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) دەفەرمووێ: کردەوەکانتان با لە چوارچێوەی تواناتان بێت، خوای گەورە بێزار نابێت تاوەکوو ئێوە بێزار دەبن.

جا لێرەدا زانایان باسی مانای (الملل - بێزاری)ـیان کردووە: ئایا مەبەست لە بێزاری حەقیقەتەکەیەتی، یان لە زمانی عەرەبیدا مەجاز هەیە و زۆر جار نموونە بە شتێک دەهێنرێتەوە، مەبەستە

ڕاستەقینەکە بۆ حاڵیکردنە، نەک چەسپاندنی ئەو مانایە بۆ زاتی خوا (عز وجل). بۆ نموونە، زۆر جار دەگوترێت: با ئەو کێشەیە چارەسەر بکەین تا لە دەست دەرنەچووە.

خودی کێشە شتێکی (ملموس - بەرجەستە) نییە بتوانین دەستی لێ بدەین، وەک چۆن دەست لە دار و بەردێک دەدەین، بەڵکوو مەبەست لە لەدەستدەرچوونەکەی ئەوەیە، کە لەژێر دەسەڵاتمان دەربچێت و تەشەنە بکات و بۆمان چارەسەر نەکرێت.

ئیمام ئیبن حەجەر (ڕەزا و ڕەحمەتی خوای لەسەر بێ)، دەربارەی مانای (الملل) دەفەرمووێت: (وَالْمَلَالُ

اسْتِثْقَالُ الشَّيْءِ وَنُفُورُ النَّفْسِ عَنْهُ بَعْدَ مَحَبَّتِهِ وَهُوَ مُحَالٌ عَلَى اللَّهِ تَعَالَى بِاتِّفَاقٍ.)[٣]

بێزاربوون لە شتێک، یانی دڵگرانبوونە پێی دوای ئەوەی خۆشت ویستووە. وەک کەسێک لە خانووێکی کۆن بێزار دەبێت کە سەرەتای کڕینی خانووەکە، زۆری پێ دڵخۆش بووە، بەڵام دواتر وردە وردە لێی بێزار دەبێت. ئایا ئەو مانایە بۆ خوای گەورە دەبێت!؟ پەنا بەخوا! پەنا بە خوا دەگرین لەوەی خوای گەورە لە مەخلووقات و لە موڵکی خۆی بێزار بێت، یان سیفەتی بێزاری بەو مانایە بۆ خوا جێگیر بکەین.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٣ فتح الباري لابن حجر (١/ ١٠٢)

بۆیە ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ لەو بوارە دەفەرمووێ:
وَأَمَّا لَفْظُهُ فِي قَوْلِهِ إِنَّ اللَّهَ لاَ يَمَلُّ حَتَّى تَمَلُّوا فَهُوَ لَفْظٌ خَرَجَ عَلَى مِثَالِ لَفْظٍ وَمَعْلُومٌ أَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لاَ يَمَلُّ سَوَاءً مَلَّ النَّاسُ أَوْ لَمْ يَمَلُّوا وَلاَ يَدْخُلُهُ مَلاَلٌ فِي شَيْءٍ مِنَ الْأَشْيَاءِ جَلَّ عَنْ ذَلِكَ وَتَعَالَى عُلُوًّا كَبِيرًا، وَإِنَّمَا جَاءَ لَفْظُ هَذَا الْحَدِيثِ عَلَى الْمَعْرُوفِ مِنْ لُغَةِ الْعَرَبِ فَإِنَّهُمْ إِذَا وَضَعُوا لَفْظًا بِإِزَاءِ لَفْظٍ جَوَابًا لَهُ أَوْ جُزْءًا ذَكَرُوهُ بِمِثْلِ لَفْظِهِ وَإِنْ كَانَ مُخَالِفًا لَهُ مَعْنَاهُ ، أَلَا ترى إلى قوله عز وجل (وجزؤا سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِثْلُهَا) الشُّورَى ٤٠ وَقَوْلُهُ تَعَالَى (فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ) الْبَقَرَةِ ١٩٤ وَالْجَزَاءُ لَا يَكُونُ سَيِّئَةً وَالْقِصَاصُ لَا يَكُونُ اعْتِدَاءً لِأَنَّهُ حَقٌّ وَجَبَ ، وَمِثْلُ ذَلِكَ قَوْلُ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ (وَمَكَرُوا وَمَكَرَ الله

والله خير المكرين) آل عمران ٥٤ التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد (١/ ١٩٥).

لەفزی (الملل - بێزاری) وەکوو نموونە هاتووە و زانراوە کە خوای گەورە بێزار نابێت ئەگەر بەندەکانی بێزار بن یان بێزار نەبن. خوای گەورە بێزاری بەسەردا نایێ و، پاک و بێگەردە لەوەی ئەو جۆرە مانایەی بەسەردا بێ. ئەو جۆرە وشەیە ئاشکرایە لای عەرەب، کە وەکوو بەرانبەر بە کار هاتووە. بۆیە خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿... فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْۚ...﴿١٩٤﴾﴾ [البقرة] جا لێرەدا مەبەستی پێ لە قیساسە. ئەگەر کەسێک زیان بە جەستەی کەسێکی تر بگەیەنێ، دەبێت قیساسی لێ دەربکرێت. عەرەب زانیویانە کە

مەبەست لە ﴿... فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ...﴾ [البقرة] قیساسە.

ئیمام ئیبن حەجەری عەسقەلانی دەفەرمووێ:

(قَوْلُهُ لَا يَمَلُّ اللَّهُ حَتَّى تَمَلُّوا هُوَ بِفَتْحِ الْمِيمِ فِي الْمَوْضِعَيْنِ وَالْمَلَالُ اسْتِثْقَالُ الشَّيْءِ وَنُفُورُ النَّفْسِ عَنْهُ بَعْدَ مَحَبَّتِهِ وَهُوَ مُحَالٌ عَلَى اللَّهِ تَعَالَى بِاتِّفَاقٍ.)[4].

هەر لەو بوارەشدا ئیمامی نەوەوی دەفەرمووێت: قَالَ الْعُلَمَاءُ الْمَلَلُ وَالسَّآمَةُ بِالْمَعْنَى الْمُتَعَارَفِ فِي حَقِّنَا مُحَالٌ فِي حَقِّ اللَّهِ تَعَالَى فَيَجِبُ تَأْوِيلُ الْحَدِيثِ قَالَ الْمُحَقِّقُونَ مَعْنَاهُ لَا يُعَامِلُكُمْ مُعَامَلَةَ الْمَالِّ فَيَقْطَعُ عَنْكُمْ

---

٤ فتح الباري لابن حجر (١/ ١٠٢).

ثَوَابَهُ وَجَزَاءَهُ وَبَسْطَ فَضْلِهِ وَرَحْمَتِهِ حَتَّى تَقْطَعُوا عَمَلَكُمْ: شرح النووي على مسلم (٦/ ٧١).

بێزاری بەو مانایەی کە لەنێو خۆماندا ناسراوە، ئەو مانایە لە خوای گەورە ناوەشێتەوە؛ دەبێت تەئویلی ئەو فەرموودەیە بکرێت. واتە بەو شێوەیە لێک بدرێتەوە کە خوای گەورە نە لە زاتی و نە لە سیفاتی، بە مەخلووقەکانی ناچێت و مەخلووقەکانیشی بەو ناچن. ئینجا لێرەدا تەئویل بە مانای لێکدانەوەی فەرموودەکە و ماناکردنیەتی. زانایان فەرموویانە: واتە خوای گەورە مامەڵەتان لەگەڵ ناکات وەکوو مامەڵەی کەسێک کە بێزار بێ لە بەرانبەرەکەی. خوای گەورە ئێوەی بە سۆز و بەزەییەکانی داپۆشیوە.

هەر بە هەمان شێوە ئیمام ئیبن جەریری تەبەڕی لە پێشەکیی کتێبە مێژووییەکەیدا (تاریخ الامم والملوك) کە بە "مێژووی تەبەڕی" ناسراوە، دەفەرمووێ: (لا تغیره الاحوال، ولا یدخله الملال.) نە حاڵەتەکان گۆڕانکاری بەسەر خوادا دێنن (عز وجل)، نە بێزاری ڕووی تێ دەکات.

کە وا بوو، لێرەدا ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ و ئیمام ئیبن جەریری تەبەڕی و ئیمام ئیبن حەجەری عەسقەلانی و ئیمامی نەوەوی، چوار لە گەورە ئیمامەکانی ئەهلی سوننە و جەماعەتن و هەر چوار بە یەک مانا، ئەو فەرموودەیە لێک دەدەنەوە و، دەیان ئیمامی تریش لە ئیمامەکانی ئەهلی سوننە، هەر بە هەمان شێوە ئەو فەرموودەیە بەو جۆرە مانا دەکەنەوە. هەر بۆ نموونە،

شێخی ئیسلام زەکەریای ئەنساڕی دەفەرمووێت: (لا یمل) أي: لا یسأم، وهو محال في حقه تعالی، فهو مجاز عن ترک الجزاء.[5]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٥ منحة الباري بشرح صحیح البخاري (٤/ ٤١٠) .

## دووەم: مانای (فاستحى الله منه) "خوای گەورە شەرمی لێ کرد"

حَدَّثَنِي عَنْ مَالِكٍ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، عَنْ أَبِي مُرَّةَ مَوْلَى عَقِيلِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، عَنْ أَبِي وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَمَا هُوَ جَالِسٌ فِي الْمَسْجِدِ، وَالنَّاسُ مَعَهُ إِذْ أَقْبَلَ نَفَرٌ ثَلَاثَةٌ، فَأَقْبَلَ اثْنَانِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَذَهَبَ وَاحِدٌ، فَلَمَّا وَقَفَا عَلَى مَجْلِسِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَلَّمَا، فَأَمَّا أَحَدُهُمَا فَرَأَى فُرْجَةً فِي الْحَلْقَةِ فَجَلَسَ فِيهَا، وَأَمَّا الْآخَرُ فَجَلَسَ خَلْفَهُمْ، وَأَمَّا الثَّالِثُ فَأَدْبَرَ ذَاهِبًا، فَلَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: " أَلَا أُخْبِرُكُمْ -[٩٦١]- عَنِ النَّفَرِ الثَّلَاثَةِ: أَمَّا أَحَدُهُمْ فَأَوَى إِلَى اللَّهِ فَآوَاهُ اللَّهُ، وَأَمَّا

الْآخَرُ فَاسْتَحْيَا فَاسْتَحْيَا اللَّهُ مِنْهُ، وَأَمَّا الْآخَرُ فَأَعْرَضَ فَأَعْرَضَ اللَّهُ عَنْهُ " التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد (١/ ٣١٥)

لەم فەرموودەیەدا باسی سێ کەس دەکات کە هاتنە مەجلیسی پێغەمبەری خوا (ﷺ). یەکیان سەیری کرد مەجلیسەکە شوێنێکی تێدایە و چووە شوێنەکە دانیشت. ئەوی تر کە زانیی بازنەی مەجلیسەکە پڕ بوویەوە، چووە دواوەی بازنەکە و دانیشت. ئەوی سێیەم نەچوو وەک ئەوی دووەم بکات، بەڵکوو مەجلیسەکەی بە جێ هێشت. ئینجا پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) باسی ئەو سێ کەسە دەکات: یەکیان ڕووی لە خوا کرد و خوای گەورە شوێنێکی پێ دا. ئەوی دووەم شەرمی کرد و دڵی

نەهات مەجلیسی پێغەمبەری خوا جێ بهێڵێت. ئەو کەسە خوای گەورە شەرمی لێ کرد. ئەوی سێیەم پشتی لە خوا کرد و خوای گەورە ڕووی لێ وەرگێڕا.

وَأَمَّا قَوْلُهُ فِي الثَّانِي فاستحي اللَّهُ مِنْهُ فَهُوَ مِنِ اتِّسَاعِ كَلَامِ الْعَرَبِ فِي أَلْفَاظِهِمْ وَفَصِيحِ كَلَامِهِمْ وَالْمَعْنَى فِيهِ وَاللَّهُ أَعْلَمُ أَنَّ اللَّهَ قَدْ غَفَرَ لَهُ لِأَنَّهُ من استحيى اللَّهُ مِنْهُ لَمْ يُعَذِّبْهُ بِذَنْبِهِ وَغَفَرَ لَهُ بَلْ لَمْ يُعَاتِبْهُ عَلَيْهِ فَكَانَ الْمَعْنَى فِي الْأَوَّلِ أَنَّ فِعْلَهُ أَوْجَبَ لَهُ حَسَنَةً وَالْآخَرُ أَوْجَبَ لَهُ فِعْلُهُ مَحْوَ سَيِّئَةٍ عَنْهُ وَاللَّهُ أَعْلَمُ.

لێرەدا ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ دەفەرمووێ: فاستحي اللَّهُ مِنْهُ فَهُوَ مِنِ اتِّسَاعِ كَلَامِ الْعَرَبِ فِي أَلْفَاظِهِمْ وَفَصِيحِ كَلَامِهِمْ وَالْمَعْنَى فِيهِ وَاللَّهُ أَعْلَمُ أَنَّ اللَّهَ قَدْ غَفَرَ لَهُ لِأَنَّهُ من استحيى اللَّهُ مِنْهُ لَمْ يُعَذِّبْهُ بِذَنْبِهِ وَغَفَرَ

لَهُ. واتە ئەو مانایە بۆ خوای گەورە، واتای لێخۆشبوونە، لەبەر ئەوەی کەسێك خوای گەورە شەرمی لێ بکات، سزای نادات و لێی خۆش دەبێت.

هەروەها ئیمامی نەوەوی دەفەرمووێ:

الثَّالِثُ فَاسْتَحَى اللَّهُ مِنْهُ أَيْ رَحِمَهُ وَلَمْ يُعَذِّبْهُ بَلْ غَفَرَ ذُنُوبَهُ وَقِيلَ جَازَاهُ بِالثَّوَابِ[٦]. ماناکە زۆر ڕوونە: ئەو شەرمەی کە بەسەر ئێمەی مرۆڤدا دێ، ئەوە بۆ خوای گەورە مەبەست نییە، بەڵکوو لێخۆشبوون و سۆز و بەزەیی خوای گەورەیە لە هەمبەر ئەو کەسە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٦ شرح النووي على مسلم (١٤/ ١٥٩)

## سێیەم: سێبەری خوای گەورە

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: "سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ، يَوْمَ لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّهُ: إِمَامٌ عَادِلٌ، وَشَابٌّ نَشَأَ فِي عِبَادَةِ اللَّهِ، وَرَجُلٌ قَلْبُهُ مُتَعَلِّقٌ بِالْمَسْجِدِ إِذَا خَرَجَ مِنْهُ حَتَّى يَعُودَ إِلَيْهِ، وَرَجُلَانِ تَحَابَّا فِي اللَّهِ اجْتَمَعَا عَلَى ذَلِكَ وَتَفَرَّقَا عَلَيْهِ، -[٩٥٣]- وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللَّهَ خَالِيًا فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ، وَرَجُلٌ دَعَتْهُ ذَاتُ حَسَبٍ وَجَمَالٍ فَقَالَ: إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ، وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ فَأَخْفَاهَا حَتَّى لَا تَعْلَمَ شِمَالُهُ مَا تُنْفِقُ يَمِينُهُ "

وَالظِّلُّ فِي هَذَا الْحَدِيثِ يُرَادُ بِهِ الرَّحْمَةُ وَاللَّهُ أَعْلَمُ.

ماناى فەرموودەكە: حەوت كەس خواى گەورە سێبەريان لێ دەكات و لەژێر سێبەرى ئەون، ئەو كاتەى كە لە سێبەرى ئەو زياتر هيچ سێبەرى تر نييە. جا ماناى سێبەرى خواى گەورە، هەندێک لە زانايان فەرموويانە يانى سێبەرى عەرشى خواى گەورە. هەندێكيش دەفەرموون لە سێبەرى خوا يان لەژێر ڕەحمەتى خوادان. بۆيە ئيمام ئيبن عەبدولبەڕ تەئويلى سێبەر بە ڕەحمەت سۆز و بەزەيى دەكات و، دەفەرمووێت:وَالظِّلُّ فِي هَذَا الْحَدِيثِ يُرَادُ بِهِ الرَّحْمَةُ وَاللَّهُ أَعْلَمُ[٧].

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٧ التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد (٢/ ٢٧٩).

## چوارەم: خۆر کە هەڵدێ، شاخی شەیتانی لەگەڵدایە

«إِنَّ الشَّمْسَ تَطْلُعُ وَمَعَهَا قَرْنُ الشَّيْطَانِ، فَإِذَا ارْتَفَعَتْ فَارَقَهَا، ثُمَّ إِذَا اسْتَوَتْ قَارَنَهَا، فَإِذَا زَالَتْ فَارَقَهَا، فَإِذَا دَنَتْ لِلْغُرُوبِ قَارَنَهَا، فَإِذَا غَرَبَتْ فَارَقَهَا. وَنَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الصَّلَاةِ فِي تِلْكَ السَّاعَاتِ»

نابێت نوێژ لە کاتی خۆرهەڵاتن بکرێ، هۆکارەکەی هەروەک پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو فەرموودەیە باسی کردووە، کە شەیتان وردە لەگەڵ هەڵاتنی خۆرەکە شاخی خۆی دەردەخات، بەو ئومێدەی ئەوەی لەو کاتەدا سوجدە دەبات، وەک

بڵێیت دڵی بەوە خۆش بێ کە سوجدەکە بۆ ئەو بێت. جا لێرەدا قەومی ئاوا هەبوونە کە خۆریان پەرستووە، وەکوو ئەوەی لە سوورەتی (النمل)ـدا باس کراوە.

﴿إِنِّي وَجَدتُّ ٱمْرَأَةً تَمْلِكُهُمْ وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ۝٢٣ وَجَدتُّهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ فَهُمْ لَا يَهْتَدُونَ۝٢٤﴾ [النمل].

ئینجا ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ هاتووە تەئویلی (وَمَعَهَا قَرْنُ الشَّيْطَانِ) دەکات بە ئوممەت و دەفەرمووێت: لە زمانی عەرەبیدا ئەو جۆرە تەئولیە جائیزە. ئوممەت بە مانای (قەرن) هاتووە: وَهَذَا التَّأْوِيلُ جَائِزٌ فِي اللُّغَةِ مَعْرُوفٌ فِي لِسَانِ الْعَرَبِ لِأَنَّ الْأُمَّةَ تُسَمَّى عِنْدَهُمْ قَرْنًا وَالْأُمَمُ قُرُونًا قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ وَقُرُونًا بَيْنَ ذلك كثيرا

وقال وكم أهلكنا قبلهم من قرن وَقَالَ فَمَا بَالُ الْقُرُونِ الْأُولَى وَقَالَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي[8].

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٨ التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد (٤/ ١١)

## پێنجەم: تەفسیری (وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا) و هاتنی خوای گەورە

خوای گەورە لەو ئایەتە باسی قیامەت دەکات و لە باسی ئەو ڕۆژە دەفەرموێت: ئەو کاتە خوا دێت و مەلائیکەت ڕیز بە ڕیز لەگەڵنی. ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ تەئویلی ئەو ئایەتە دەکات و دەفەرموێت: هاتنی خوای گەورە، ناڵێین جووڵە و جێگۆڕکێیە، لەبەر ئەوەی جووڵە و جێگۆڕکێ نیشانەی (جەوهەر و جسم)ـبوونە. خوای گەورە جەوهەر و جەستە نییە، کە وا بوو، هاتنیشی جووڵە و جێگۆڕکێ نییە. (لَا نُسَمِّيهِ وَلَا نَصِفُهُ وَلَا نُطْلِقُ عَلَيْهِ إِلَّا مَا سَمَّى بِهِ نَفْسَهُ عَلَى مَا تَقَدَّمَ ذِكْرُنَا لَهُ مِنْ وَصْفِهِ لِنَفْسِهِ لَا شَرِيكَ لَهُ وَلَا نَدْفَعُ مَا وَصَفَ بِهِ نَفْسَهُ لِأَنَّهُ دَفْعٌ لِلْقُرْآنِ وَقَدْ قَالَ

اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا وَلَيْسَ مَجِيئُهُ حَرَكَةً وَلَا زَوَالًا وَلَا انْتِقَالًا لِأَنَّ ذَلِكَ إِنَّمَا يَكُونُ إِذَا كَانَ الْجَائِي جِسْمًا أَوْ جَوْهَرًا فَلَمَّا ثَبَتَ أَنَّهُ لَيْسَ بِجِسْمٍ وَلَا جَوْهَرٍ لَمْ يَجِبْ أَنْ يَكُونَ مَجِيئُهُ حَرَكَةً وَلَا نَقْلَةً وَلَوِ اعْتَبَرْتَ ذَلِكَ بِقَوْلِهِمْ جَاءَتْ فُلَانًا قِيَامَتُهُ وَجَاءَهُ الْمَوْتُ وَجَاءَهُ الْمَرَضُ وَشِبْهُ ذَلِكَ مِمَّا هُوَ مَوْجُودٌ نَازِلٌ بِهِ وَلَا مَجِيءَ لَبَانَ لَكَ وَبِاللَّهِ الْعِصْمَةُ وَالتَّوْفِيقُ)[٩].

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٩ التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد (٧/ ١٣٧)

## شەشەم: مانای (پێکەنین - الضحك)

"يَضْحَكُ اللَّهُ إِلَى رَجُلَيْنِ: يَقْتُلُ أَحَدُهُمَا الآخَرَ. كِلاَهُمَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ. يُقَاتِلُ هَذَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيُقْتَلُ. ثُمَّ يَتُوبُ اللَّهُ عَلَى الْقَاتِلِ فَيُقَاتِلُ فَيُسْتَشْهَدُ."

کەسێک کەسێکی تر دەکوژێت، خوای گەورە بە سۆز و بەزەیی خۆی، هەردووکیان قەبووڵ دەکات، لەبەر ئەوەی بکوژەکە دوای ئەوە کەسەکە دەکوژێت، تەوبە دەکات و، لەپێناو خوادا شەهید دەکرێ. بۆیە هەردووکیان بەر ڕەحمەتی خوای گەورە دەکەون و هەردووکیان دەچنە بەهەشت. جا لێرەدا ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ تەئویلی (الضحك) دەکات بە سۆز و بەزەیی و، دەفەرموێت ئەوە مەجازە:وَأَمَّا قَوْلُهُ

يَضْحَكُ اللَّهُ فَمَعْنَاهُ يَرْحَمُ اللَّهُ عَبْدَهُ عِنْدَ ذَاكَ وَيَتَلَقَّاهُ بِالرَّوْحِ وَالرَّاحَةِ وَالرَّحْمَةِ وَالرَّأْفَةِ وَهَذَا مَجَازٌ مَفْهُومٌ وَقَدْ قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِي السَّابِقِينَ الْأَوَّلِينَ وَالتَّابِعِينَ لَهُمْ بِإِحْسَانٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَقَالَ فِي الْمُجْرِمِينَ فَلَمَّا آسَفُونَا انْتَقَمْنَا مِنْهُمْ وَأَهْلُ الْعِلْمِ يَكْرَهُونَ الْخَوْضَ فِي مِثْلِ هَذَا وَشِبْهِهِ مِنَ التَّشْبِيهِ كُلِّهِ فِي الرِّضَا وَالْغَضَبِ وَمَا كَانَ مِثْلُهُ مِنْ صِفَاتِ الْمَخْلُوقِينَ وَبِاللَّهِ الْعِصْمَةُ والتوفيق[10].

ئینجا ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ دەفەرمووێت: ئەهلی عیلم پێیان خۆش نەبووە لە مانای ئەو جۆرە سیفەتانە بکۆڵنەوە.

---

١٠ التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد (١٨/ ٣٤٤) .

## حەوتەم: لە کاتی شەرحکردنی ئایەت و فەرموودەکانی (الاسماء والصفات) دەست بۆ جەستەت مەبە

سَمِعْتُ مَالِكَ بْنَ أَنَسٍ يَقُولُ مَنْ وَصَفَ شَيْئًا مِنْ ذَاتِ اللَّهِ مِثْلَ قَوْلِهِ وَقَالَتِ الْيَهُودُ يَدُ اللَّهِ مَغْلُولَةٌ وَأَشَارَ بِيَدِهِ إِلَى عُنُقِهِ وَمِثْلَ قَوْلِهِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ فَأَشَارَ إِلَى عَيْنَيْهِ أَوْ أُذُنِهِ أَوْ شَيْئًا مِنْ بَدَنِهِ قُطِعَ ذَلِكَ مِنْهُ لأَنَّهُ شَبَّهَ اللَّهَ بِنَفْسِهِ[11].

خوای پەروەردگار نە زاتی و نە سیفەتی لە دروستکراوەکانی ناچێت. بۆیە ئیمام مالیکی کوڕی

---

[11] التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد (٧/ ١٤٥)

ئەنەس دەیفەرموو: هەر کەسێک وەسفی زاتی خوای گەورە بکات و دەست بۆ جەستەی خۆی ببات، ئەوە دەبێت ئەو بەشەی ببڕدرێت! مەبەستی ئیمام مالیک کە جوولەکە دەیانگوت: يَدُ اللَّهِ مَغْلُولَةٌ. مەبەستی ئەوان ئەوە بوو کە خوای گەورە دەستی کراوە نییە، یانی ڕەزیلە (پەنا بە خوا). بۆیە لە کاتی شەرحی ئەو جۆرە سیفەت و ناوانە، نابێت دەست بۆ دەست و گوێی خۆت ببەیت.

## هەشتەم: خوای گەورە هەموو شەوێك دێتە ئاسمانی دونیا، یان ڕەحمەتی دێتە ئاسمانی دونیا

يَنْزِلُ رَبُّنَا، تَبَارَكَ وَتَعَالَى، كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا. حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الآخِرُ، فَيَقُولُ: مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ؟ مَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ؟ مَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ؟

لە شەرحی ئەو فەرموودەیە، خوای گەورە هەموو شەوێک دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا، ئەو کاتەی شەو بەشێکی مابێت، ئینجا خوای گەورە دەفەرموێت: کێ نزا و پاڕانەوە دەکات، تا نزا و پاڕانەوەکەی قەبووڵ بکەم. کێ داواکاریی هەیە، با بۆی جێبەجێ بکەم.

کێ داوای لێخۆشبوون لە گوناهەکانی دەکات، با لێی خۆش ببم.

ئینجا دوای ئەوەی ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ گفتوگۆیەکی زۆر لەسەر ئەو فەرموودەیە دەکات، ئەو باوەڕی وایە کە خوای گەورە لەسەر عەرشە، سەر بەقوتابخانەی ئەهلی حەدیسیشە. دەفەرمووێ: خەڵکێک لە ئەهلی حەدیس گوتوویانە ئەو فەرموودەیە مانای ئەوەیە کە "سۆز و بەزەیی" خوای گەورە دادەبەزێت، هەر وەک حەبیبی کاتیبی مالیک دەڵێت: ئەوە بۆچوونی ئیمام مالیک بووە، بەڵام خەڵکێکی تر وەڵامیان داوەتەوە و ئەوەیان قبەووڵ نەبووە و گوتوویانە: هەموو کات ئەمری خوای گەورە

دادەبەزێت، لەبەر چی تایبەتی بکەین بە دوا بەشی کۆتایی شەو؟!

وَقَدْ قَالَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ الْأَثَرِ أَيْضًا إِنَّهُ يَنْزِلُ أَمْرُهُ وَتَنْزِلُ رَحْمَتُهُ وروى ذلك عن حبيب كاتب مالك وَغَيْرِهِ وَأَنْكَرَهُ مِنْهُمْ آخَرُونَ وَقَالُوا هَذَا لَيْسَ بِشَيْءٍ لِأَنَّ أَمْرَهُ وَرَحْمَتَهُ لَا يَزَالَانِ يَنْزِلَانِ أَبَدًا فِي اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَتَعَالَى الْمَلِكُ الْجَبَّارُ الَّذِي إِذَا أَرَادَ أَمْرًا قَالَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ فِي أَيِّ وَقْتٍ شَاءَ وَيَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِ مَنْ يَشَاءُ مَتَى شَاءَ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْكَبِيرُ الْمُتَعَالُ.

وَقَدْ رَوَى مُحَمَّدُ بْنُ عَلِيٍّ الْجَبَلِيُّ وَكَانَ مِنْ ثِقَاتِ الْمُسْلِمِينَ بِالْقَيْرَوَانِ قَالَ حَدَّثَنَا جَامِعُ بْنُ سَوَادَةَ بِمِصْرَ قَالَ حَدَّثَنَا مُطَرِّفٌ عَنْ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ أَنَّهُ سُئِلَ عَنِ الْحَدِيثِ إِنَّ اللَّهَ يَنْزِلُ فِي اللَّيْلِ إِلَى سَمَاءِ الدُّنْيَا فَقَالَ

مَالِكٌ يَتَنَزَّلُ أَمْرُهُ وَقَدْ يُحْتَمَلُ أَنْ يَكُونَ كَمَا قَالَ مَالِكٌ رَحِمَهُ اللَّهُ[12].

موحەممەدی کوڕی عەلی جەبەلی، یەکێک بووە لەو موسڵمانانەی کە جێی متمانە بووە لە شاری قەیرەوان. دەڵێت جامعی کوڕی سەوادە لە میسڕ بۆی گێڕامەوە، گوتی موتەڕیف گێڕایەوە، کە ئیمام مالیکی کوڕی ئەنەس دەربارەی ئەو فەرموودەیە پرسیاری لێ کرا. لە وەڵامدا فەرمووی: فەرمانەکانی خوای گەورە دادەبەزن. ئینجا ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ دەفەرموێت: دەوریش نییە ماناکە وا بێ، وەکوو ئەوەی مالیک بۆی چووە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت).

---

١٢ التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد (٧/ ١٤٣)

ئینجا هەر لەو بوارە دەفەرمووێت: وَقَدْ قَالَتْ فِرْقَةٌ مُنْتَسِبَةٌ إِلَى السُّنَّةِ إِنَّهُ يَنْزِلُ بِذَاتِه! وَهَذَا قَوْلٌ مَهْجُورٌ لِأَنَّهُ تَعَالَى ذِكْرُهُ لَيْسَ بِمَحَلٍّ لِلْحَرَكَاتِ وَلَا فِيهِ شَيْءٌ مِنْ عَلَامَاتِ الْمَخْلُوقَاتِ[13].

تاقمێک کە خۆیان داوەتە پاڵ سوننە، گوتوویانە خوای گەورە بە "زات"ـی خۆی دادەبەزێت. ئەوەش گوتەیەکی پشتگوێخراوە، لەبەر ئەوەی خوای گەورە جووڵە و ڕووداوی بەسەر نایەت و هیچ نیشانەیەکی تێدا نییە بە دروستکراوەکانی بچێت.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

١٣ الاستذكار (٢/ ٥٣٠).

## نۆیەم: خوای گەورە لە ئاسمانە و عیلمی لە هەموو شوێنێکە

قَالَ مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِي السَّمَاءِ وَعِلْمُهُ فِي كُلِّ مَكَانٍ لَا يخلو منه مكان.

ئیمام مالیکی کوڕی ئەنەس دەفەرمووێت: خوای گەورە لە ئاسمانە و عیلمی لە هەموو شوێنێکە. بێگومان لە ئاسمانە، یانی لە سەرووی ئاسمانەکانە. لەبەر ئەوەی (في) لە زمانی عەرەبی بە مانای (على)ش دێت. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿... وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِي جُذُوعِ ٱلنَّخْلِ...﴾ [طه] یانی لەسەر، نەک بە مانای لەنێو دارخورما بێت.

ئینجا ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ لە وەڵامی ئەوانەی دەڵێن خوای گەورە لە هەموو شوێنێکە، دەفەرمووێت: وَأَمَّا احْتِجَاجُهُمْ بِقَوْلِهِ عَزَّ وَجَلَّ ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِۖ مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَآ أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُواْۖ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُواْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ٧﴾ [المجادلة].

دەفەرمووێت زاناکانی هاوەڵان و تابیعییەکان ئەوانەی زانستم لێ وەرگرتوون، هەموو ئەوانە فەرموویانە، خوای گەورە لەسەر عەرشە (عز وجل) و بە عیلمی لە هەموو شوێنێکە. لِأَنَّ عُلَمَاءَ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ الَّذِينَ حَمَلْتُ عَنْهُمُ التَّأْوِيلَ فِي الْقُرْآنِ قَالُوا

فِي تَأْوِيلِ هَذِهِ الْآيَةِ هُوَ عَلَى الْعَرْشِ وَعِلْمُهُ فِي كُلِّ مَكَانٍ وَمَا خَالَفَهُمْ فِي ذَلِكَ أَحَدٌ يُحْتَجُّ بِقَوْلِهِ[١٤].

---

١٤ التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد (٧/ ١٣٨).

## دەیەم: تف بە ئاڕاستەی قیبلە مەکەن

حَدَّثَنِي يَحْيَى، عَنْ مَالِكٍ عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأَى بُصَاقًا فِي جِدَارِ الْقِبْلَةِ، فَحَكَّهُ. ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ، فَقَالَ: «إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ يُصَلِّي فَلَا يَبْصُقْ قِبَلَ وَجْهِهِ، فَإِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى قِبَلَ وَجْهِهِ إِذَا صَلَّى». التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد (١٤/ ١٥٤)

وَأَمَّا قَوْلُهُ فِي هَذَا الْحَدِيثِ فَإِنَّ اللَّهَ قِبَلَ وَجْهِهِ إِذَا صَلَّى فَكَلَامٌ خَرَجَ عَلَى التَّعْظِيمِ لِشَأْنِ الْقِبْلَةِ وَإِكْرَامِهَا وَاللَّهُ أَعْلَمُ[١٥].

---

١٥ التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد (١٤/ ١٥٧)

پێغەمبەری خوا (ﷺ) بینیی تفێک بەو دیوارەی مزگەوتەوە بوو کە ڕووی لە قیبلەیە. تفەکە وشک بووەوە و پێغەمبەری خۆشەویستمان تفەکەی کڕاند و، فەرمووی: لە کاتی نوێژدا تف بە ئاڕاستەی قیبلە مەکەن، لەبەر ئەوەی نوێژکەر لە کاتی نوێژکردنیدا ڕووی لە خوایە. ئینجا ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ دەفەرمووێ: وَأَمَّا قَوْلُهُ فِي هَذَا الْحَدِيثِ فَإِنَّ اللَّهَ قِبَلَ وَجْهِهِ إِذَا صَلَّى فَكَلَامٌ خَرَجَ عَلَى التَّعْظِيمِ لِشَأْنِ الْقِبْلَةِ وَإِكْرَامِهَا وَاللَّهُ أَعْلَمُ. مەبەست لەو فەرموودەیە، کە خوای گەورە بەرانبەر نوێژکەرە، ئەوە بۆ نیشاندانی گەورەییی قیبلە و ڕێزگرتن لە قیبلەیە.

واتە: ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ مەبەستی ئەوەیە کە بە هەڵە لە ڕوواڵەتی فەرموودەکە حاڵی نەبن. خوای

گەورە لە ڕووی نوێژکەرە لە کاتی نوێژکردن و تف بە ئاڕاستەی قیبلە مەکەن، بۆ حورمەت و گەورەییی قیبلەیە، نەک وا تێ بگەن کە خوا بەرانبەرتانە! جا لێرەدا ئێمە کە دەچینە نێو نوێژ دەڵێین: وَجَّهْتُ وَجْهِي لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ، وَالْأَرْضَ حَنِيفًا مُسْلِمًا، وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ[16] ڕوو لە قیبلە دەکەین، کەچی دەڵێین ڕوو لەو خوایە دەکەین کە بەدیهێنی ئاسمانەکان و زەوییە.

ئینجا ئیمام حافزی عێراقی لە کتێبی (طرح التثریب في شرح التقریب) بەرگی دووەم، لاپەڕە ٤٠١، دوای

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

١٦ مسند أحمد ط الرسالة (٢/ ١٣٣)

ئەوە ئەو قەولەی ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ دەهێنێتەوە، دەفەرمووێت:

وقال ابن عبدالبر: وهذا كلام خرج على التعظيم لشأن القبلة واكرامها. قال وقد نزع بهذا الحديث بعض من ذهب مذهب المعتزلة في ان الله تعالى في كل مكان وليس على العرش.

قال: وهذا جهل من قائله لان قوله في الحديث: يبزق تحت قدمه وعن يساره، ينقض ما اصلوه في انه في كل مكان. هذا كلام ابن عبدالبر.

ئینجا ئیمام حافیزی عێراقی دەفەرمووێ: هذا كلام ابن عبدالبر، وهو احد القائلين بالجهة، فاحذره، وانما ذكرته لانبه عليه، لئلا يغتر به.

ئەوە گوتەی ئیبن عەبدولبەڕە، بە گوتەکەی ئەوم هێناوەتەوە، بۆ ئەوەی کەس بەو گوتەیە نەخەڵەتێت، لەبەر ئەوەی ئیبن عەبدولبەڕ (جهة) بۆ خوای گەورە دادەنێت.

قسەکانی ئیمام حافزی عێراقی زۆر ڕوونن، پشتیوان بە خوا لە باسی ئیمام حافزی عێراقی، زیاتر تیشک دەخەینە سەر ئەو خاڵە.

## یازدەهەم: تەبەڕوك بە شوێنەواری پێغەمبەران و پیاوچاكان

وَحَدَّثَنِي عَنْ مَالِكٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَلْحَلَةَ الدِّيلِيِّ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عِمْرَانَ -[٤٢٤]- الْأَنْصَارِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ قَالَ: عَدَلَ إِلَيَّ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ وَأَنَا نَازِلٌ تَحْتَ سَرْحَةٍ بِطَرِيقِ مَكَّةَ. فَقَالَ: «مَا أَنْزَلَكَ تَحْتَ هَذِهِ السَّرْحَةِ؟» فَقُلْتُ: أَرَدْتُ ظِلَّهَا. فَقَالَ: «هَلْ غَيْرُ ذَلِكَ؟» فَقُلْتُ: لَا مَا أَنْزَلَنِي إِلَّا ذَلِكَ. فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «إِذَا كُنْتَ بَيْنَ الْأَخْشَبَيْنِ مِنْ مِنًى، وَنَفَخَ بِيَدِهِ نَحْوَ الْمَشْرِقِ، فَإِنَّ هُنَاكَ وَادِيًا يُقَالُ لَهُ السُّرَرُ. بِهِ شَجَرَةٌ سُرَّ تَحْتَهَا سَبْعُونَ نَبِيًّا»

تَحْتَهَا سُرَرُهُمْ يَعْنِي وُلِدُوا تَحْتَهَا يُقَالُ قَدْ سر الطفل إِذَا قُطِعَتْ سُرَّتُهُ وَفِي (هَذَا) الْحَدِيثِ دَلِيلٌ عَلَى التَّبَرُّكِ بِمَوَاضِعِ الْأَنْبِيَاءِ وَالصَّالِحِينَ وَمَقَامَاتِهِمْ وَمَسَاكِنِهِمْ وَإِلَى هَذَا قَصَدَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ بِحَدِيثِهِ هَذَا وَاللَّهُ أَعْلَمُ[17].

ئیبن عومەر (ڕەزا و ڕەحمەتی خوای گەورەی لەسەر بێ)، دەگێڕێتەوە: ئەگەر ڕێت لەو دۆڵە کەوت کە دەکەوێتە نێوان دوو شاخ کە پێی دەگوترێت دۆڵی (السرر)، لەو دۆڵاییە درەختێکی لێیە، لەژێر ئەو درەختە حەفتا لە پێغەمبەرەکان مژدەیان پێ دراوە. هەندێکیش دەفەرموون مانای (سُرَّ تَحْتَهَا سَبْعُونَ

---

١٧ التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد (١٣/ ٦٤).

نَبِیًّا) یانی حەفتا لە پێغەمبەرەکان لەژێر ئەو درەختە لە دایک بوون و ناوکیان بڕدراوە. ئینجا ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ دەفەرموویت: ئەو فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دەکرێت تەبەڕوک بکەین بە شوێنەواری پێغەمبەران و پیاوچاکان. کە وا بوو، ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ باوەڕی بە تەبەڕوک هەبووە بە شوێنەواری پێغەمبەران و پیاوچاکان.

## دوازدەهەم: خوای گەورە لە ئاسمانە و لەسەر عەرشە

ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ، باوەڕی وایە کە خوای گەورە لەسەر عەرشە، لە سەرووی ئاسمانەکان. وەڵامی موعتەزیلە و جەهمییەکان دەداتەوە و بەڵگەی زۆر لەسەر ئەوە دەهێنێت کە خوای گەورە لەسەر عەرشە، نەک لە هەموو شوێنێک بێت، هەر وەک موعتەزیلە و جەهمییەکان بۆی دەچن. دەفەرمووێت بەڵگەی ڕاستیی ئەو بۆچوونە ئەم ئایەتانەن: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ۝٥﴾ [طه].

﴿... ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ... ۝٥٤﴾ [الأعراف] ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِيَ دُخَانٞ فَقَالَ لَهَا وَلِلۡأَرۡضِ ٱئۡتِيَا

طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَآ أَتَيْنَا طَآئِعِينَ﴿١١﴾ [فصلت] ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى﴿١﴾ [الأعلى] ﴿... إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلْعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرْفَعُهُۥ...﴿١٠﴾ [فاطر] ﴿... فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُۥ...﴿١٤٣﴾ [الأعراف] ﴿ءَأَمِنتُم مَّن فِى ٱلسَّمَآءِ أَن يَخْسِفَ بِكُمُ ٱلْأَرْضَ فَإِذَا هِىَ تَمُورُ﴿١٦﴾ [الملك]... ئا بەم شێوەیە چەند ئایەت لەو بوارە دەهێنێتەوە، ئینجا دەفەرمووێت:

وَهَذِهِ الآيَاتُ كُلُّهَا وَاضِحَاتٌ فِي إِبْطَالِ قَوْلِ الْمُعْتَزِلَةِ وَأَمَّا ادِّعَاؤُهُمُ الْمَجَازَ فِي الاِسْتِوَاءِ وَقَوْلُهُمْ فِي تَأْوِيلِ اسْتَوَى اسْتَوْلَى فَلَا مَعْنَى لَهُ لأنه غير ظَاهِرٌ فِي اللُّغَةِ وَمَعْنَى الاِسْتِيلاَءِ فِي اللُّغَةِ الْمُغَالَبَةُ وَاللَّهُ لاَ يُغَالِبُهُ وَلَا يَعْلُوهُ أَحَدٌ وَهُوَ الْوَاحِدُ الصَّمَدُ وَمِنْ حَقِّ

الْكَلَامِ أَنْ يُحْمَلَ عَلَى حَقِيقَتِهِ حَتَّى تَتَّفِقَ الْأُمَّةُ أَنَّهُ أُرِيدَ بِهِ الْمَجَازُ...

ئەو ئایەتانە بەڵگەن لەسەر پووچەڵکردنەوەی بۆچوونی موعتەزیلەکان. موعتەزیلەکان کە دەڵێن ئیستوا بە مەجاز هاتووە، (استوی) بە (استولی) لە قەڵەم دەدەن. ئەوە هیچ مانای نییە، لەبەر ئەوەی (الاستلاء) لە زمانی عەرەبی مانای (المغالبة)ی تێدایە. مەبەستی ئیمام لە (المغالبة) ئەوەیە کە دوو کەس کێشەیان لەسەر شتێکی دیاریکراو هەبێت و دواتر یەکیان بەسەر ئەوی تردا زاڵ (غالب) بێ. ئەوە لە زمانی عەرەبی لەسەر وەزنی (المفاعلة)یە، یانی دەبێت دوو کەس تێیدا بەشدار بن، یەکیان بشکێ و ئەوی تر بەسەریدا زاڵ بێت. بۆیە ئیبن عەبدولبەڕ پێی

وایە لە زمانی عەرەبی (استولی) تەنیا بەو مانایە دێت. کە وا بوو، نابێت (استوی) بە (استولی) لە قەڵەم بدەین. بەم جۆرە وەڵامی موعتەزیلەکان دەداتەوە. ئینجا دەفەرمووێت:

وَمِنْ حَقِّ الْكَلَامِ أَنْ يُحْمَلَ عَلَى حَقِيقَتِهِ حَتَّى تَتَّفِقَ الْأُمَّةُ أَنَّهُ أُرِيدَ بِهِ الْمَجَازُ. حەقی (الکلام - گوتە) ئەوەیە حەقیقەتەکەی کە پێی باس کراوە مەبەست بێ، تاوەکوو ئوممەت کۆڕا دەبن لەسەر ئەوەی لەو بابەتە دیاریکراوە (مانایەکی خوازراو - المجاز) مەبەستە. جا لێرەدا گرنگە ئەوە بزانین ئەو قسانەی ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ پێچەوانەی بۆچوونی پێشتری نییە، کە تەئویلی مانای (الضحل و نزول و جاء)ـی کرد، بەڵکوو لەو شوێنانەی کە مەجازی بە کار

هێناوە، پێی وایە ئەوە بۆچوونی ئوممەتە، بۆیە مەجازی بە کار هێناوە. هەر وەک لەو بڕگەیە زۆر بە ڕوونی دەفەرمووێت: ناکرێت بڵێین مەجاز، تاوەکوو ئوممەت کۆڕا دەبن لەسەر مەجازبوونی ئەو گوتەیە. سەرنجی دەربڕینەکەی ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ بدەن: وَمِنْ حَقِّ الْكَلَامِ أَنْ يُحْمَلَ عَلَى حَقِيقَتِهِ حَتَّى تَتَّفِقَ الْأُمَّةُ أَنَّهُ أُرِيدَ بِهِ الْمَجَازُ.

ئینجا دەفەرمووێ: إِذْ لَا سَبِيلَ إِلَى اتِّبَاعِ مَا أُنْزِلَ إِلَيْنَا مِنْ رَبِّنَا إِلَّا عَلَى ذَلِكَ وَإِنَّمَا يُوَجَّهُ كَلَامُ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ إِلَى الْأَشْهَرِ وَالْأَظْهَرِ مِنْ وُجُوهِهِ مَا لَمْ يَمْنَعْ مِنْ ذَلِكَ مَا يَجِبُ لَهُ التَّسْلِيمُ) واتە دەبێت ئەو ڕێگەیە بگرینە بەر، بۆ شوێنکەوتنی قورئانی پیرۆز، کەلامی خوا ئاڕاستە دەکرێت بەو شێوەیەی کە ماناکەی دیار

و زانراوە، ئەگەر ئەو مانایە قەدەغە نەبێت بە خاڵێکی تر کە دەبێ تێیدا تەسلیم ببین.

ئەو بۆچوونەی ئیبن عەبدولبەڕ زۆر ڕوونە لەسەر ئەوەی کە بابەت هەیە دەبێت تەسلیمی ببین، بەبێ لێکۆڵینەوە لە ماناکەی. ئینجا دەفەرمووێت: وَلَوْ سَاغَ ادِّعَاءُ الْمَجَازِ لِكُلِّ مُدَّعٍ مَا ثَبَتَ شَيْءٌ مِنَ الْعِبَارَاتِ وَجَلَّ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَنْ أَنْ يُخَاطِبَ إِلَّا بِمَا تَفْهَمُهُ الْعَرَبُ فِي مَعْهُودِ مُخَاطَبَاتِهَا مِمَّا يَصِحُّ مَعْنَاهُ عِنْدَ السَّامِعِينَ وَالاسْتِوَاءُ مَعْلُومٌ فِي اللُّغَةِ وَمَفْهُومٌ وَهُوَ الْعُلُوُّ وَالارْتِفَاعُ عَلَى الشَّيْءِ وَالاسْتِقْرَارُ وَالتَّمَكُّنُ فِيهِ.

ئەگەر ڕەوا بێ بۆ هەموو کەسێک پەنا بۆ (مەجاز) ببات، ئەوکات هیچ لە ماناکان جێگیر نەدەبوون. خوای گەورە زۆر لەوە گەورەترە کەلامەکەی بە

جۆرێک بنێرێت کە عەرەب تێی نەگەن. بەو جۆرەی کە لای عەرەب ناسراوە، خۆیان بەو شێوازە قسەکردنە ئاشنان، بۆیە ئیستوا لە زمانی عەرەبی زانراوە، کە بە مانای بەرزی و بڵندی بەسەر شتەکان و دامەزران و جێگیربوون دێت.

ئینجا هەر لەو بوارەوە، واتە دەربارەی شوێن (المكان) دەفەرمووێت:

وَثَبَتَ بِالْوَاضِحِ مِنَ الدَّلِيلِ أَنَّهُ كَانَ فِي الْأَزَلِ لَا فِي مَكَانٍ وَلَيْسَ بِمَعْدُومٍ فَكَيْفَ يُقَاسُ عَلَى شَيْءٍ مِنْ خَلْقِهِ أَوْ يَجْرِي بَيْنَهُ وَبَيْنَهُمْ تَمْثِيلٌ أَوْ تَشْبِيهٌ تَعَالَى اللَّهُ عَمَّا يَقُولُ الظَّالِمُونَ عُلُوًّا كَبِيرًا الَّذِي لَا يَبْلُغُ مِنْ وَصْفِهِ إِلَّا إِلَى مَا وَصَفَ بِهِ نَفْسَهُ أَوْ وَصَفَهُ بِهِ نَبِيُّهُ وَرَسُولُهُ أَوِ اجْتَمَعَتْ عَلَيْهِ الأُمَّةُ الْحَنِيفِيَّةُ عَنْهُ.

ئەوە دامەزراوە و جێگیرە کە خوای گەورە لە ئەزەلەوە لە (مکان - شوێن) نەبووە و مەعدوومیش نەبووە. جا چۆن دەکرێت خوای گەورە بە مەخلووقاتی خۆی قیاس بکرێت، یان تەشبیهـ و لێکچوواندن لەنێوان خوا و بەندەکانی هەبێت!؟ خوای گەورە بەرز و بڵند و پاک و بێگەردە، لەو گوتانەی ستەمکاران دەیڵێن. خوای گەورە وەسف ناکرێت، تەنیا بەوە نەبێت کە خۆی وەسفی خۆی کردووە، یان پێغەمبەرەکەی وەسفی کردووە، یان ئوممەت کۆڕا بن لەسەر وەسفەکە.

جا ئەوە خاڵێکی یەکجار گرنگە کە ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ سەرنجمانی بۆ ڕادەکێشێت. بۆ نموونە، خەڵکێک هەن، شوێن (المکان)ـیان کردووەتە مەرجی

خوایەتیی خوای گەورە (پەنا بە خوا)، لەبەر ئەوەی بەپێی عەقڵی ئەوان نابێت هیچ مەوجوودێک بەبێ (شوێن - المكان) بوونی هەبێت! جا ئەوە بۆچوونێکی زۆر ترسناکە و دەبێت ئاگاداری ئەوە بین، کە خوای گەورە بوونی هەبووە بەر لەوەی (شوێن - المكان) خەلق بکات، لەبەر ئەوەی بەر لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و، بەر لە دروستکردنی "زەمان و مەکان"، خوای گەورە بوونی هەبووە. زەمان و مەکانیش ناکرێنە مەرجی خوایەتیی خوای گەورە (عزو جل).

بۆیە (المكان - شوێن) هیچ کەسێک بۆ خوای گەورەی دانەناوە، بەو مەبەستەی کە خوای گەورە لە خۆ بگرێت (پەنا بەخوا). هەر لەو بوارە کەسێکی

وەکوو ئیمام ابو نصر عبدالله کوڕی سەعیدی سجزی کە لە ساڵی ٤٤٤ کۆچی وەفاتی کردووە، کە زۆر توندە لەسەر ئەشعەرییەکان و زۆر بە توندی وەڵامیان دەداتەوە، کەچی دەربارەی (شوێن - المکان) دەفەرموێت:

(ولیس في قولنا: ان الله سبحانه فوق العرش تحدید، وانما تحدید یقع للمحدثات، فمن العرش الی ما تحت الثری محدود والله سبحانه فوق ذالك بحیث لا مکان ولا حد، لاتفاقنا: ان الله سبحانه کان ولا مکان، ثم خلق المکان وهو کما کان قبل خلق المکان) بڕوانە لاپەڕە ١٣١ کتێبی (رسالة السجزی الی اهل زبید في الرد علی مَن انکر الحرف والصوت). ئینجا هەر لەو کتێبە، لە لاپەڕە ١٣٢ دەڵێت: خوای

گەورە سنووردار ناکرێت (التحدید). ئەوانەی باسی (الحد) دەکەن بۆ خوای گەورە، ئەوانەن کە پێیان وایە خوای گەورە لە هەموو شوێنێکە. ئینجا دەڵێت: لای ئێمە خوای گەورە تێکەڵ نییە بە شوێن (مکان)، لە سەرووی هەموو مەخلووقێکە. (وانما یقول بالتحدید من یزعم انه سبحانه بکل مکان، وقد علم ان الامکنة محدودة، فاذا کان فیها بزعمهم کان محدودا وعندنا انه مباین للامکنة، ومن حلها ومن فوق کل محدث، فلا تحدید في قولنا، وهو ظاهر لا خفاء به).

ئینجا ئیمام (ئیبن عەبدولبەڕ) بەردەوام دەبێت لە وەڵامدانەوەی موعتەزیلە و جەهمییەکان، ئەوانەی

دەڵێن خوای گەورە لە هەموو شوێنێکە و، دەفەرمووێت:

لأنه في الأزل غير كَائِنٍ فِي مَكَانٍ وَكَذَلِكَ نَقْلَتُهُ لَا تُوجِبُ مَكَانًا وَهَذَا مَا لَا تَقْدِرُ الْعُقُولُ عَلَى دَفْعِهِ وَلَكِنَّا نَقُولُ اسْتَوَى مِنْ لَا مَكَانَ إِلَى مَكَانٍ وَلَا نَقُولُ انْتَقَلَ وَإِنْ كَانَ الْمَعْنَى فِي ذَلِكَ وَاحِدًا أَلَا تَرَى أَنَّا نقول له العرش وَلَا نَقُولُ لَهُ سَرِيرٌ وَمَعْنَاهُمَا وَاحِدٌ وَنَقُولُ هُوَ الْحَكِيمُ وَلَا نَقُولُ هُوَ الْعَاقِلُ وَنَقُولُ خَلِيلُ إِبْرَاهِيمَ وَلَا نَقُولُ صَدِيقُ إِبْرَاهِيمَ وَإِنْ كَانَ الْمَعْنَى فِي ذَلِكَ كُلِّهِ وَاحِدًا لَا نُسَمِّيهِ وَلَا نَصِفُهُ وَلَا نُطْلِقُ عَلَيْهِ إِلَّا مَا سَمَّى بِهِ نَفْسَهُ عَلَى مَا تَقَدَّمَ ذِكْرُنَا لَهُ مِنْ وَصْفِهِ لِنَفْسِهِ لَا شَرِيكَ لَهُ وَلَا نَدْفَعُ مَا وَصَفَ بِهِ نَفْسَهُ لِأَنَّهُ دَفْعٌ لِلْقُرْآنِ.

دەڵێت: خوای گەورە لە ئەزەلەوە لە (شوێن - مکان) نەبووە، جێگۆڕکێش بۆ ئەو مانای شوێن ناگەیەنێ. ئەوەش عەقڵ ناتوانێت قەبووڵی نەکات، بەڵام ئێمە دەڵێین (ئیستوای) کردووە لە (لامکان) بۆ (مکان) و ناڵێین جێی گۆڕیوە لە "شوێنێک بۆ شوێنێکی تر" ئەگەرچی هەردوو بە یەک مانا بێن، بەڵام ئێمە ئەو وشانە بە کار دەهێنین کە خوای گەورە بە کاری هێناون. بۆیە دەڵێن (عەرش) ناڵێن تەخت (سریر)، ئەگەرچی بە یەک ماناش بێن[١٨]. بە هەرحاڵ، ئەو چەند قسانەی ئەو دواییەی ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ، جێی نیگەرانیی ئیمام حافیزی عێراقی

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

١٨ التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد (٧/ ١٢٩).

بووەو وەڵامی داوەتەوە لە کتێبی (طرح التثريب في شرح التقريب) بەرگی دووەم لاپەڕە ٤٠١.

لە کۆتاییدا دەڵێین، لە ئیسلامدا چەند ئوسوولێک هەن کە ئوممەت لەسەری کۆڕا و یەکدەنگن، وەک ڕوکنەکانی ئیسلام و ڕوکنەکانی ئیمان، بەڵام تێگەیشتن بۆ هەندێک لەو ڕوکنانە، وەکوو بابەتی (الاسماء والصفات)، تێگەیشتن لە هەندێک لەناو سیفەتە جوانەکانی خوای گەورە، زانایان بۆچوونی جیاوازیان لەسەر هەیە. هەر لەبەر ئەوەشە ئەهلی سوننە و جەماعەت چۆن بوون بە چوار مەزهەبی فیقهی، بە هەمان شێوە بوون بە سێ تێگەیشتن لە بابەتەکانی (الاسماء والصفات)، ئەوانیش "ئەشعەرییەکان و ماتوریدییەکان و حەنبەلییەکان"ــن.

بەڵام خەڵکێک دواتر هاتن خۆیان داوەتە پاڵ مەزهەبی ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و چەند بابەتێک کە ئەوان پێیان پەسەندە و مەزهەبی خۆیانە، کردوویانە بە مەزهەبی ئەهلی سوننە و جەماعەت و غەیری خۆیان لەو چوارچێوەیە دەردەکەن. کە پێمان وایە ئەوە ستەمێکی گەورەیە. خوای گەورە ئیمانی هەموومان سەلامەت بکات، کردەوەکانمان لێ قەبووڵ بکات و بمانباتە ژێر ڕەحمەتی خۆی.

## دوو تێبینیی گرنگ:

یەکەم: ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ، لە ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەگێڕێتەوە، کە ئەوان کۆدەنگن لەسەر ئیقرار بە سیفەتە بەرز و جوانەکانی خوای گەورە، ئەو سیفەتانەی لە قورئان و سوننەدا هاتوون. ماناکەشی لەسەر حەقیقەت لێک بدەنەوە، نەک بە مەجاز. واتە مەبەستی ئەو ناو و سیفەتانە حەقیقییە نەک مەجاز. ئەهلی سوننە باسی چۆنیەتییان نەکردووە، بەڵام ئەهلی بیدعە لە جەهمییەکان و موعتەزیلە و خەواریج، هەموویان نکووڵیی لەو سیفەتانە دەکەن.

قال أبو عمر أهل السنة مجموعون عَلَى الْإِقْرَار بِالصِّفَاتِ الْوَارِدَةِ كُلِّهَا فِي الْقُرْآنِ وَالسُّنَّةِ وَالْإِيمَانِ بِهَا وَحَمْلِهَا عَلَى الْحَقِيقَةِ لَا عَلَى الْمَجَازِ إِلَّا أَنَّهُمْ لَا يُكَيِّفُونَ شَيْئًا مِنْ ذَلِكَ وَلَا يَحُدُّونَ فِيهِ صِفَةً مَحْصُورَةً وَأَمَّا أَهْلُ الْبِدَعِ وَالْجَهْمِيَّةُ وَالْمُعْتَزِلَةُ كُلُّهَا وَالْخَوَارِجُ فَكُلُّهُمْ يُنْكِرُهَا وَلَا يَحْمِلُ شَيْئًا مِنْهَا عَلَى الْحَقِيقَةِ وَيَزْعُمُونَ أَنَّ مَنْ أَقَرَّ بِهَا مُشَبِّهٌ وَهُمْ عِنْدَ مَنْ أَثْبَتَهَا نَافُونَ لِلْمَعْبُودِ وَالْحَقُّ فِيمَا قَالَهُ الْقَائِلُونَ بِمَا نَطَقَ بِهِ كِتَابُ اللَّهِ وَسُنَّةُ رَسُولِهِ وَهُمْ أَئِمَّةُ الْجَمَاعَةِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ[١٩].

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

١٩ التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد.(٧/ ١٤٤).

ئیمام ئیبن تەیمیە ڕێک ئەو دەقە نەقڵ دەکات لە کتێبی (مجموعة الفتاوی) بەرگی دووەم، لاپەڕە ١٤٢. جا ئەوەی لای من زۆر سەیر بوو: لەبەر چی تەنیا ئەو دەقە نەقڵ بکرێ و تەواوی دەقەکانی تر پشتگوێ بخرێن؟! بۆیە بە گرنگم زانی بیر و بۆچوونی ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ بکەوێتە بەر دیدی خوێنەر و دەبێت ئەوە بزانین کە تەنیا لە ڕووی دەقێکەوە ناتوانین تەواوی بیر و بۆچوونی ئەو ئیمامە بزانین لە بابەتی (الاسماء والصفات). ئینجا ئەو دەقەی ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ پێچەوانەی باقیی دەقەکانی تری نییە کە لێیانەوە نەقڵ کرد، بەڵام ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ دەقەکان دەسەلمێنێت و لە ماناکانی ناکۆڵێتەوە. بۆیە ئەو ڕاشکاوانە دەفەرمووێت:

وَنَحْنُ نَقُولُ بِمَا ثَبَتَ عَنْهُ وَلَا نَعْدُوهُ وَنَكِلُ مَا جَهِلْنَا مِنْ مَعْنَاهُ إِلَيْهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَبِهِ عَلِمْنَا مَا عَلِمْنَا وَهُوَ الْمُبَيِّنُ عَنِ اللَّهِ مُرَادَهُ وَالْقُرْآنُ عِنْدَنَا مَعَ هَذَا كُلِّهِ كَلَامُ اللَّهِ وَصِفَةٌ مِنْ صِفَاتِهِ لَيْسَ بِمَخْلُوقٍ[20].

ئێمە دەڵێین بەوەی کە جێگیرە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەو بەشە مانایەی کە لێی حاڵی نابین، ئەوە دەگێڕینەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەوەی زانیومانە لە ڕێی پێغەمبەری خواوە بووە. قورئانیش کەلامی خوایە، کەلامیش سیفەتێکە لە سیفەتەکانی خوای گەورە و مەخلووق نییە. هەر لەبەر ئەوەشە ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ پێی ڕەوا نەبووە کەسێك بڵێ

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٢٠ التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد (١٩/ ٢٣١)

خوای گەورە بە "زات"ـی خۆی دادەبەزێت و، دەفەرمووێ:

قَالَ نُعَيْمٌ يَنْزِلُ بِذَاتِهِ وَهُوَ عَلَى كُرْسِيِّهِ - قَالَ أَبُو عُمَرَ لَيْسَ هَذَا بِشَيْءٍ عِنْدَ أَهْلِ الْفَهْمِ مِنْ أَهْلِ السُّنَّةِ لأَنَّ هَذَا كَيْفِيَّةٌ وَهُمْ يَفْزَعُونَ مِنْهَا لأَنَّهَا لاَ تَصْلُحُ إِلاَّ فِيمَا يُحَاطُ بِهِ عِيَانًا وَقَدْ جَلَّ اللَّهُ وَتَعَالَى عَنْ ذَلِكَ وَمَا غَابَ عَنِ الْعُيُونِ فَلاَ يَصِفُهُ ذَوُو الْعُقُولِ إِلاَّ بِخَبَرٍ وَلاَ خَبَرَ فِي صِفَاتِ اللَّهِ إِلاَّ مَا وَصَفَ نَفْسَهُ بِهِ فِي كِتَابِهِ أَوْ عَلَى لِسَانِ رَسُولِهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلاَ نَتَعَدَّى ذَلِكَ إِلَى تَشْبِيهٍ أَوْ قِيَاسٍ أَوْ تَمْثِيلٍ أَوْ تَنْظِيرٍ فَإِنَّهُ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ[21].

---

٢١ التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد (٧/ ١٤٤)

نوعەیم گوتوویەتی کە خوای گەورە بە زاتی خۆی دادەبەزێت، لەسەر کورسییشە. ئینجا ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ دەفەرمووێت: ئەو بۆچوونە هیچ سەنگی نییە لای ئەوانەی تێدەگەن لە ئەهلی سوننە، لەبەر ئەوەی ئەهلی سوننە لەگەڵ دیاریکردنی چۆنیەتی نین. چۆنیەتی بۆ زاتێک دەکرێت کە سنووردار بێت. خوای گەورە زۆر لەو جۆرە بۆچوونە گەورەترە. ئەوانە خاوەن عەقڵن وەسفی خوای گەورە دەکەن، لە ڕێی دەقەکانی کیتاب و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ئەوە تێپەڕ ناکەین. پەنا بۆ قیاس و لێکچوواندن نابەین. هیچ وەک خوای گەورە نابێت و خوای گەورە دەبینێت و دەبیسێت.

کە وا بوو، دەبێت ئاگاداری ئەوە بین کە بۆچوونی ئیبن عەبدولبەڕ لە هەموو دەقەکانی دەخوێنرێتەوە، نەوەک تەنیا دەقێک زەق بکەینەوە و باقیی دەقەکانی تری پشتگوێ بخەین.

ئینجا ئیمام مالیک زۆری پێ ناخۆش بووە لەو جۆرە بابەتانە قسان بکرێت، بۆیە نەهی لەوە کردووە ئەو بابەتانە ورد بکرێنەوە. ئەو کاتەی کابرای عێراقی پرسیاری مانای ئیستوای لێ کرد، ئیمام مالیک وەڵامی دایەوە و فەرمووی پرسیارت لە شتێکی نەزانراو نەکردووە، قسەت لە شتێک کرد کە مەعقوول نییە، تۆ پیاوێکی خراپی و، فەرمانی کرد لە مەجلیسەکەی دەربکرێت.

وَحَدَّثنَا أَيُّوبُ بْنُ صَلَاحِ الْمَخْزُومِيُّ بِالرَّمْلَةِ قَالَ كُنَّا عِنْدَ مَالِكٍ إِذْ جَاءَهُ عِرَاقِيٌّ فَقَالَ لَهُ يَا أَبَا عَبْدِ اللَّهِ مَسْأَلَةٌ أُرِيدُ أَنْ أَسْأَلَكَ عَنْهَا فَطَأْطَأَ مَالِكٌ رَأْسَهُ فَقَالَ لَهُ يَا أَبَا عَبْدِ اللَّهِ الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى كَيْفَ استوى قال سألت عن غير مجهول وتكلمت في غير مَعْقُولٌ إِنَّكَ امْرُؤُ سَوْءٍ أَخْرِجُوهُ فَأَخَذُوا بِضَبْعَيْهِ فأخرجوه وقال يحيى بن إبرهيم بن مزين إنما كره ملك أَنْ يَتَحَدَّثَ بِتِلْكَ الْأَحَادِيثِ لِأَنَّ فِيهَا حَدًّا وَصِفَةً وَتَشْبِيهًا وَالنَّجَاةُ فِي هَذَا الانْتِهَاءُ إِلَى مَا قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ وَوَصَفَ بِهِ نَفْسَهُ بِوَجْهٍ وَيَدَيْنِ وَبَسْطٍ وَاسْتِوَاءٍ وَكَلَامٍ فَقَالَ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ وَقَالَ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ وَقَالَ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ القيامة والسموات مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ وَقَالَ الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ

اسْتَوَى فَلْيَقُلْ قَائِلٌ بِمَا قَالَ اللَّهُ وَلْيَنْتَهِ إِلَيْهِ وَلَا يَعْدُوهُ وَلَا يُفَسِّرُهُ وَلَا يَقُلْ كَيْفَ فَإِنَّ فِي ذَلِكَ الْهَلَاكَ لِأَنَّ اللَّهَ كَلَّفَ عَبِيدَهُ الْإِيمَانَ بِالتَّنْزِيلِ وَلَمْ يُكَلِّفْهُمُ الْخَوْضَ فِي التَّأْوِيلِ الَّذِي لَا يَعْلَمُهُ غَيْرُهُ[٢٢].

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٢٢ التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد (٧/ ١٥١).

## تێبینیی دووەم:

ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ لە کتێبی (جامع بيان العلم وفضله (٢/ ٩٤٣)ـدا ریوایەتێك لە (خويز منداد) نەقڵ دەکا:

وَكُتُبُ أَهْلِ الْأَهْوَاءِ وَالْبِدَعِ عِنْدَ أَصْحَابِنَا هِيَ كُتُبُ أَصْحَابِ الْكَلَامِ مِنَ الْمُعْتَزِلَةِ وَغَيْرِهِمْ...

گوتەکەی (خويز منداد) دیارە کە باسی موعتەزیلە و غەیری موعتەزیلە دەکات، ئینجا دەڵێ: أَهْلُ الْأَهْوَاءِ عِنْدَ مَالِكٍ وَسَائِرِ أَصْحَابِنَا هُمْ أَهْلُ الْكَلَامِ فَكُلُّ مُتَكَلِّمٍ فَهُوَ مِنْ أَهْلِ الْأَهْوَاءِ وَالْبِدَعِ أَشْعَرِيًّا كَانَ أَوْ غَيْرَ أَشْعَرِيٍّ وَلَا تُقْبَلُ لَهُ شَهَادَةٌ فِي الْإِسْلَامِ وَيُهْجَرُ وَيُؤَدَّبُ عَلَى بِدْعَتِهِ، فَإِنْ تَمَادَى عَلَيْهَا اسْتُتِيبَ مِنْهَا.

ئەهلی ئەهوا لای مالیک و مالیکییەکان، ئەهلی کەلامن. هەموو موتەکەلیمێک ئەهلی ئەهوا و بیدعەیە، جا ئەشعەری بێت یان غەیرە ئەشعەری و، شەهادەتی لێ وەرناگیرێت. جا ئەوەی کە سەیرە لێرە، ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ لە (التمهید و الاستذکار) زۆربەی وەڵامەکانی بۆ موعتەزیلەیە، خەڵکێک هاتوون ئەو گوتەیەی ئیمام (خویز منداد)یان هێناوە و مەبەستیانە ئاڕاستەی وەڵامەکانی ئیمام ئیبن عەبدولبەڕ بگۆڕن لە موعتەزیلەوە بۆ ئەشعەرییەت، کەچی زۆربەی ئەو تەئویل و تەفویزانەی (ئەشعەرییەت) کردوویانە، بە هەمان شێوە ئیمام ئیبن عەبدولبەڕیش کردوویەتی؛ هەر وەکوو لەو خاڵانەی سەرەوە ئاماژەمان پێ کرد. ئینجا دەربارەی خودی

ئیمام (خویز منداد)، گلەییی لێ کراوە و ڕەخنە لە بۆچوونەکانی گیراوە. بۆ نموونە ئیمام قازی عیاز دەربارەی دەفەرمووێ:

أبو بكر بن خُويز منداد رحمه الله

ويقال خوين منداد. إذ كذا كنّاه أبو إسحاق الشيرازي. وسماه محمد بن أحمد بن عبد الله. ورأيت على كتبه تكنيته، بأبي عبد الله. وفي نسبته: محمد بن أحمد بن علي بن إسحاق. وقال الشيرازي، أيضاً تفقه بالأبهري وسمع الحديث. يروي عن أبي داسة، وأبي الحسن التمار، وأبي الحسن المصيصي، وأبي إسحاق التجيبي، وأبي العباس الأصم. وله كتاب كبير في الخلاف، وكتاب في أصول الفقه، وفي أحكام القرآن، وعنده شواذ عن مالك. وله اختيارات وتأويلات على

المذهب في الفقه، والأصول، لم يرجع عليها حذاق المذهب.

ئینجا دەفەرموێ: ولم يكن بالجيد النظر، ولا بالقوي الفقه. وقد تكلم فيه أبو الوليد الباجي. قال: إني لم أسمع له في علماء العراق بذكر. وكان يجانب الكلام جملة، وينافر أهله، حتى تعدى ذلك الى منافرته المتكلمين من أهل السنّة. وحكم على الكل بأنهم من أهل الأهواء، الذين قال مالك في مناكحتهم وشهادتهم وإمامتهم وعيادتهم وجنائزهم[٢٣].

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٢٣ ترتيب المدارك وتقريب المسالك (٧/ ٧٧)

هەروەها ئیمام ئیبن حەجەر دەربارەی دەفەرمووێ:

"محمد" بن علي بن إسحاق بن خويز منداد ويقال خواز منداد الفقيه المالكي البصري يكنى أبا عبد الله

صنف كتبا كثيرة منها كتابه الكبير في الخلاف وكتابه في أصول الفقه وكتابه في أحكام القرآن وعنده شواذ عن مالك واختيارات وتأويلات لم يعرج عليها حذاق المذهب كقوله إن العبيد لا يدخلون في خطاب الأحرار وأن خبر الواحد مفيد العلم وانه لا يعتق على الرجل سوى الإباء والابناء وقد تكلم فيه بن الوليد الباجي ولم يكن بالجيد النظر ولا بالقوي في الفقه وكان يزعم أن مذهب مالك أنه لا يشهد جنازة متكلم

ولا يجوز شهادتهم ولا مناكحتهم ولا امانتهم وطعن ابن عبد البر فيه أيضا وكان في أواخر المائة الرابعة[٢٤].

لەو دوو نەقڵە، هیی ئیمام قازی عیاز و هیی ئیمام ئیبن حەجەر، زۆر بە ڕوونی گوتوویانە کە ئەو کەسە هەندێ گوتە و بۆچوونی داوەتە پاڵ ئیمام مالیك، ئەو گوتە و بۆچوونانەی هیی ئیمام مالیك و مالیکییەکان نییە، بەڵکوو ڕەخنەیان لێ گرتووە.

ئەوەی باسمان کرد، تەنیا بۆ ئەوە بوو کە بزانین خاڵی هاوبەش زۆرە لەنێو زانایان و دەکرێت ئێمە لەسەر خاڵە هاوبەشەکان کۆ ببینەوە و سنووری ئەو زانا پایەبەرزانە نەترازێنین.

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٢٤ لسان الميزان (٥/ ٢٩١).

## پێرست

# ئیبن عەبدولبەڕ

حورمەتی ئیمامەکان و خۆشەویستیان لە دیندایە، و ئاشنا بوون بەو ئیمامانە سوودێکی زۆری هەیە، بەتایبەت لە زەمەنێکی وەکوو ئەو ڕۆ مان کە هەوڵێکی زۆر لە ئارادایە بۆ شکاندنی هێماکانی ئەهلی سوننە و جەماعەت و خستنیان لەبەرچاوی گەنجەکانی ئەو ئوممەتە، بەوە ش دەتوانن بگەن بە ئامانجە گڵاوەکانیان لە شێواندنی ڕاستییەکان و بەلاڕێبردنی هەنگاوەکان.

ناساندنی ئیمامەکان و ئەگەر بەکورتیش بێت بە ئەرکێکی گەورەی دەزانین، هەر لەبەر ئەوەشە دەستمان کرد بە نووسینی ئەو زنجیرەیە (لە خزمەت زانا و ئیمامەکانی ئەهلی سوننە) خودای گەورە لێمانی قبووڵ بکات و تەرازووی کردەوەی چاکەمانی پێ قورس بکات.





کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی




لقی یەکەم : بەرامبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری

لقی دووەم : چوار ڕیانی شێخ مەحمود بەرامبەر مزگەوتی محمود عەلاف

  /M.Ktebxana ٠٧٨٢٤٦٧١٣٩٤ - ٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤